عەقیدەی



# أبو أحمد إبن الحسين
# ناسراو بە إبن الحداد الشافعي

لە سەدەکانی سێ و چوار ژیاوە



وەرگێڕانی :

**الشاب السني**

١٤٤٥ هـ

## ناساندنی خاوەنی بیروباوەڕ :

ئەوەندەی دیار ئەکەوێت لە چوارسەدەکان هـ وەفاتی کردووە لە طەبەقەی اللالكائي يە **٤١٨** هـ رحمه الله

کونیەکەی: أبو أحمد

ناسراوە بە: ابن الحداد

شافعی مەزهەب بووە

## سەرچاوەی بیروباوەڕ :

ئەم بیروباوەڕە لە کتێبی (اجتماع الجيوش الإسلامية على غزو المعطلة الجهمية)ی ابن قيم الجوزية هاتووە بە کاملی

ابن قیم لە (اجتماع الجیوش الإسلامیة) ئەڵێ :

وتەی پێشەوا حوججەی ئیسلام أبي أحمد ابن الحسین الشافعي ناسراو بە ابن الحداد رحمە اللە :

سوپاس و ستایش بۆ اللە و هەر ئەومان بەسە، وە سەلام لەسەر ئەو بەندانەی کە هەڵیبژاردوون، وە صەلاوات و سەلامی اللە لەسەر گەورەمان محمد و خانەوادە پاکەکەی بێت.

اللە تەوفیقت بدات بۆ وتەی درووست، وە هیدایەتت بدات بۆ ڕێی ڕاست، پرسیارت لێم کردووە دەربارەی بیروباوەڕی حەق و مەنهەجی ڕاست کە پێویستە لەسەر بەندەی داوالێکراو - واتە بەندەیەک کە عاقڵ و ئازاد و باڵغ بێت - بیروباوەڕی پێی بێت و وابەست بێت پێوەی و بیکات بە بنچینە و بناغەی خۆی .

منیش ئەڵێم وە اللە تەوفیقم بدات بۆ ڕاستی و پێکان :

١ - ئەوەی واجبە لەسەر بەندە بیروباوەڕی پێی بێت و وابەستەی بێت لە ڕووکەش و ناخیدا ئەوەیە کە بەڵگەی لەسەرە لە کتێبی اللە تعالی، وە سوننەتی نێردراوەکەی ﷺ، وە کۆدەنگی سەردەمی یەکەم لە زانایانی سەلەف و ئەو پێشەوایانەی کە نیشانەی دینن، وە پێشەنگی دوای خۆیانن لە موسڵمانان، وە ئەوەش بەندە بیروباوەڕی پێی بێت و دانی پیا بنێت و بزانێت بە دڵ و زمانی کە :

الله تاک و تەنهایە، لە کەس نەبووە و کەسی لێ نەبووە، هیچ هاوشانێکی نیە، هیچ خوایەک نیە شایەنی پەرستن بێت بە حەق جگە لەو، وە هاوبەشی نیە، وە هاوشێوەی نیە، وە وەزیری نیە، وە هیچ کەسێک لە سەریەوە نییە، وە هیچ هاوشانێکی نییە، وە خێزانی نیە، وە کوڕی نیە.

٢ - قدیم[1] یێکی هەتاهەتاییە، یەکەمە بەبێ دەستپێک، وە کۆتایە بەبێ تەواوبوون، وەصفکراوە بە صیفەتە کەمالەکانی : ژیان، وە قودرەت، وە زانست، وە ویست، وە بیستن، وە بینین، وە مەزنی، وە جوانی، وە گەورەیی، وە منەت و فەزڵ، وە هیچ شتێک دەستەوەستانی ناکات، وە لە هیچ شتێک ناچێت، وە هیچ شتێک ون نابێت لە عیلمەکەی - واتا هیچ شتێک نیە کە ئەو نەیزانێت و بێ ئاگا بێت لێی - ﴿يَعۡلَمُ خَآئِنَةَ ٱلۡأَعۡيُنِ وَمَا تُخۡفِي ٱلصُّدُورُ﴾ (غافر : ١٩) .

﴿لَا يَعۡزُبُ عَنۡهُ مِثۡقَالُ ذَرَّةٖ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَآ أَصۡغَرُ مِن ذَٰلِكَ وَلَآ أَكۡبَرُ إِلَّا فِي كِتَٰبٖ مُّبِينٖ﴾ (سبأ : ٣) .

---

**: (١) وشەی قدیم بە مانای کۆن دێت، واتە پێش ئەو هیچ کەسێک نەبووە و خۆی یەکەمە، وە باشتر وایە وشەی الأول بەکاربهێنرێت بۆ الله تعالی چونکە لە قورئان و فەرموودەدا هاتووە .**

**الأول ەکە هەم ناوی الله تعالی یە، وە هەم هەواڵپێدانێکە دەربارەی سیفەتێکی الله تعالی، بەڵام وشەی قدیم تەنها هەواڵپێدانە دەربارەی سیفەتێکی الله تعالی، وە ناو نییە، وە**

لەسەر موسوڵمان واجبە پەیوەست بێت بەو دەستەواژەیانەی کە قورئان و سوننەتدا هاتووە چونکە بێپێویستت ئەکەن لە شتی تر.

٣ - بەدوورە لە هەموو کەموکوڕی و خراپەیەک، پاک ڕاگیراوە لە هەموو عەیب و نەخۆشیەک .

٤ - درووستکاری ڕزق دەرە، ژیەنەری مرێنەرە، زیندووکەرەوەی میراتگرە[٢]، سەرەتا و کۆتایە، لە سەروو هەموو شتێکەوەیە و زانایە بە ناخ و دەروون، داواکەری زاڵبووە، وە پاداشتدەرەوەی سزادەرە، وە لێخۆشبووی پێزانە بە شوکرانەبژێری .

---

: (٢) واتە خودی مرۆڤ خۆی خاوەنی هیچ شتێک نییە و خاوەنی ڕاستەقینە الله تعالی یە، هی خۆیەتی و هەربۆ خۆشی ئەمێنێتەوە .

٥ - قەدەری هەموو شتێکی داناوە و قەزای کردووە و حوکمی داوە، لە خێر و شەڕ، وە قازانج و زەرەر، وە گوێڕایەڵی و سەرپێچی، وە ئەنقەست و بیرچوونەوە، وە بەخشین و گرتنەوە، ڕوونادات لە موڵکەکەی ئەوەی نەیەوێت، دادگەرە لە قەزاکردنەکەی و ستەمکار نیە بەرامبەر درووستکراوەکانی .

٦ - ڕەتکەرەوەی فەرمانەکانی نیە، وە کەس نیە حوکمەکەی دوا بخات، پەروەردگاری جیهانیانە، پەرستراوی سەرەتاکان و کۆتاکانە، خاوەنی ڕۆژی لێپرسینەوەیە | لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ | (الشورى : ١١) .

٧ - وەصفی ئەکەین بەوەی خۆی وەصفی نەفسی کردووە لە کتێبە مەزنەکەیدا، وە لەسەر زمانی نێردراوە بەڕێزەکەی ﷺ، لەوە تێناپەڕین، وە زیادی ناکەین، بەڵکو لەوێدا ئەوەستین، وە کۆتایی پێ ئەهێنین لەوێدا، وە ناچینە ناویەوە بە ڕەئی و قیاس، لەبەر دووریی لە شێوەکان[٣] | ذَٰلِكَ مِن فَضۡلِ ٱللَّهِ عَلَيۡنَا وَعَلَى ٱلنَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَشۡكُرُونَ | (یوسف : ٣٨) .

---

(٣) : واتە تاکە سەرچاوەی ناسینی الله تعالی بریتیە لە قورئان و سوننەت، وە بە هیچ شێوەیەک ناکرێت بە قیاس و ڕەئی خۆمان هەوڵ بدەین الله تعالی بناسین چونکە الله تعالی لە هیچ شتێک ناچێت هەتا قیاسی بکەین بە شتێکی تر یان ڕەئ و بۆچوونمان هەبێت دەربارەی، بەڵام ئەشعەریە جەهمیە جەهەننەمیە زەندیقەکان دێن کوفری کەلام پێش ئەخەن بەسەر قورئان و سوننەتدا و لەو ڕێگەیەوە بە چەندین یاسای دەستکردی کوفری کەلامی تەواوی سیفەتەکانی الله تعالی یان پەکخستووە .

٨ - وە بەرزبووەتەوە لەسەر عەرشەکەی لەسەروو هەموو درووستکراوەکانی، وەک چۆن هەواڵی داوە لە کتێبەکەی وە لەسەر زمانی

نێردراوەکانی صلى الله عليهم وسلم بەبێ چواندن و پەکخستن و تەحریف و تەئویل .

---

**: لەم خاڵەدا نووسەر ئاماژە بەوە ئەدات کە عەقیدەی هەموو پێغەمبەران ئەوە بوو کە الله تعالى لەسەر عەرشە بە ذاتی خۆی، وە ئەشعەریە جەهمیە جەهەننەمیەکانیش خاوەنی ئەو جۆرە عەقیدەیە بە کافرو موشەبیهە و موجەسیمە ئەزانن!**

**وە سیفەتەکە ناچوێنێت بە سیفەتی دروستکراوەکانی، وە بە تەئویل و مانای گۆڕین سیفەتەکە پەک ناخات .**

**٩** - وە بەهەمان شێوە هەموو ئەو صیفەتانەی هاتوون بەڕێی ئەکەین وەک چۆن هاتووە بەبێ زیاد خستنە سەری، وە لەمەدا چاو لە زانایانی سەلەفی صالح ئەکەین الله لێیان ڕازی بێت، وە بێدەنگ ئەبین لەوەی ئەوان بێدەنگ بوون لێی، وە لێکی ئەدەینەوە ئەوەی لێکیان داوەتەوە - لێکدانەوە واتا وەک چۆن ئەوان لێی تێگەشتوون ئێمەش ئاوا لێی تێئەگەین - وە ئەوان پێشەنگن لەم دەروازەیە | **أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَىٰهُمُ ٱللَّهُۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمۡ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ** | **(الزمر: ١٨)** .

**١٠** - وە باوەڕمان هەیە بە قەدەر بە خێر و شەڕیەوە، وە شیرین و تاڵیەوە، ئەوە لە الله وەیە هیچ ڕێگریەک نیە لەوەی حوکمی ئەدات، وە هەڵوەشێنەرەوە نیە لەوەی حوکمی ئەدات، وە کارەکانی بەندەکان باش و خراپی دروستکراوی

اللە ن و وە بە قەدەر دانراوە لەسەریان، هیچ درووستکارێک نیە بۆیان جگە لەو - درووستکاری کارەکانی بەندەکانە - ، وە هیچ دانەرێک نیە جگە لەو - واتا خۆی کارەکانی بەندەکان درووست ئەکات و خۆشی دای ئەنێت لەسەریان - | لِيَجْزِىَ ٱلَّذِينَ أَسَـٰٓـُٔوا۟ بِمَا عَمِلُوا۟ وَيَجْزِىَ ٱلَّذِينَ أَحْسَنُوا۟ بِٱلْحُسْنَى | **(النجم : ٣١)** .

| لَا يُسْـَٔلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْـَٔلُونَ | **(الأنبياء : ٢٣)** .

**١١ -** وە ئەو لەوەدا عەدلە و ستەمکار نیە، هێندەی دەنکە گەردیلەیەک ستەمیان لێ ناکات | وَإِن تَكُ حَسَنَةً يُضَـٰعِفْهَا وَيُؤْتِ مِن لَّدُنْهُ أَجْرًا عَظِيمًا | **(النساء : ٤٠)** .

**١٢ -** وە بەهەمان شێوە ڕزق و ئەجەلەکان دانراون زیاد و کەم ناکەن.

**١٣ -** وە باوەڕمان وایە و دانی پیا ئەنێین و شاهێدی ئەدەین کە محمد بەندە و نێردراویەتی، وە هەڵی بژاردووە لەناو پێغەمبەرەکانیدا، وە ئەو کۆتای پێغەمبەرانە، وە گەورەی نێردراوانە ناردوویەتی | بِٱلْهُدَىٰ وَدِينِ ٱلْحَقِّ لِيُظْهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ وَلَوْ كَرِهَ ٱلْمُشْرِكُونَ | **(الصف : ٩)** .

**١٤ -** وە باوەڕمان وایە هەموو ئەو کتێبانەی اللە دایبەزاندووە حەقن .

**١٥ -** وە هەموو ئەو نێردراوانەی اللە ناردوویەتی حەقن .

١٦ - وە فریشتەکان حەقن، وە جبرائیل حەقە، وە میکائیل حەقە، وە إسرافیل حەقە، وە عزرائیل - فریشتەی ڕۆح کێشان - حەقە، وە هەڵگرانی عەڕش و نووسەرەکان لە فریشتەکان حەقن.

١٧ - وە شەیطانەکان و جنۆکەکان حەقن.

١٨ - وە کەڕاماتی پیاوچاکان و موعجیزاتی پێغەمبەران حەقن.

١٩ - وە چاو - چاو پیسی - حەقە.

٢٠ - وە سیحر ڕاستێتی هەیە و کاریگەری هەیە لەسەر لاشەکان.

٢١ - وە پرسیارکردنی منکر و نکیر حەقە.

٢٢ - وە تاقیکردنەوەی گۆڕ حەقە، وە نیعمەتەکەی حەقە، وە سزاکەی حەقە.

٢٣ - وە زیندووبوونەوەی دوای مردن حەقە.

٢٤ - وە هەستانی قیامەت، وە وەستان لەبەردەم الله تعالى لە ڕۆژی قیامەت بۆ حساب کردن و تۆڵەکردنەوە.

٢٥ - وە میزان - تەرازوو - حەقە.

٢٦ - وە صیراط - پردی صراط - حەقە.

**٢٧** - وه حەوض - كەوثەر - حەقە.

**٢٨** - وه ئەو شەفاعەتەی پێغەمبەرمان پێی تایبەتمەند كراوه لە ڕۆژی قیامەت حەقە.

**٢٩** - وه شەفاعەتی فریشتەكان و پێغەمبەران و ئیمانداران حەقە.

**٣٠** - وه بەهەشت حەقە، وه دۆزەخ حەقە، وه ئەوان درووستكراون و لەناوناچن و نافەوتێن.

**٣١** - وه دەرچوونی ئیمانداران لە ئاگر دوای چوونە ناوەوەی حەقە، وه تێیدا نامێنێتەوه هەركەس دەنكە گەردیلەیەك ئیمان لە دڵیدا هەبێت.

**٣٢** - وه ئەهلی تاوانە گەورەكان لەژێر ویستی الله تعالى دان، بڕیار نادەین لەسەریان بە ئاگر، بەڵكو ترسمان هەیە لێیان، وه بڕیار نادەین لەسەریان بە بەهەشت، بەڵكو ئومێدمان هەیە بۆیان.

**٣٣** - وه ئیمان وتەیە بە زمان، وه ناسینە بە دڵ، وه كردارە بە ئەندامەكانی لەش، وه زیاد ئەكات و كەم ئەكات.

**٣٤** - وه ئیمانداران پەروەردگاریان عز وجل ئەبینن لە ڕۆژی دوایی بەبێ پەردە، وه كافران لە بینینەكەی داپۆشراون.

**٣٥** - وە قورئان کەلامی الله ی پەروەردگاری جیهانیانە، ڕۆحی ئەمین - جبريل عليه السلام - دایبەزاندووە، لەسەر دڵی محمد کۆتای پێغەمبەران ﷺ، دایبەزاندووە بە عیلمەکەی وە فریشتەکان شاهێدن، وە بەسە کە الله شاهێد بێت، وە غەیر مەخلوقە - واتە قورئان - .

**٣٦** - وە سورەتەکان و ئایەتەکان و پیتە بیستراوەکان و وشە تەواوەکان کە ئینسان و جنۆکە بێدەسەڵاتن لەوەی بە هاوشێوەی بێنن ئەگەر هەنێکیان بۆ هەنێکی تریشیان پاڵپشت بن، مەخلوق نیە وەک ئەوەی موعتەزیلەکان ئەیلێن، وە گوزارشتیش نیە لێوەی وەک کولابیەکان ئەیلێن .

---

: ئەشعەریە جەهمیەکان لە بابەتی خلق القرآن دا عەقیدەیان لە کوللابیە جەهمیەکانەوە وەرگرتووە، وە لە بابەتەکانی تری سیفات یشدا عەقیدەیان لە جەهمیەکان وەرگرتووە .

کاتێک کوللابیەکان لە ڕووکەشدا ئەڵێن قورئان کەلامی الله یە ئەوا مەبەستیان لە کەلامی نەفسیە کە کوفرێکە خۆیان دایانهێناوە، وە ئەوە پیت و دەنگی نیە، وە ئەو قورئانەی ئەخوێنرێتەوە و ئەنووسرێت گوزارشتە لە کەلامی الله، هەمان قسەی جەهمیەکانە کە نەفی کەلامی الله ئەکەن، جیاوازیەکە ئەوەیە جەهمیەکان و موعتەزیلەکان بە ئاشکرا وا ئەڵێن، بەڵام کوللابیەکان و ئەشعەریەکان ئەیشارنەوە و بەرگێکی بەبەردا ئەکەن.

السجزي لە نامەکەی بۆ ئەهلی زبید لاپەڕە ١٣٨ هاوهەڵوێستیی ئەشعەریەکان بۆ موعتەزیلەکان لە مەسەلەی قورئاندا پیشان ئەدات و ئەڵێ: موعتەزیلە ئەڵێن: سورەت و

ئایەتەکان مەخلوقن وە ئەوە قورئانێکی دروستکراوە، وە ئەشاعیرە ئەڵێن: قورئان کەلامی الله یە، وە سورەت و ئایەتەکان کەلامی الله نین، بەڵکو گوزارشتە لێوەی، وە ئەوە مەخلوقە، هاوهەڵوێست بوون لە وتنی ئەوەی مەخلوقە، بەڵکو زیادیان کرد بەسەریانەوە بەوەی کە قورئان نیە، وە کەلامی الله نیە، ئەگەر بانگەشەی ئەوەیان کرد کە ئەوان دان ئەنێن بەوەی قورئانە ئەوە پێیان بڵێ: ئێوە دانی پیا ئەنێن لەسەر شێوەی مەجاز، لەبەرئەوەی لە مەزهەبی ئێوە قورئان مەخلوق نیە، وە پیتەکان مەخلوقن، وە سورەتەکانیش پیتەکانن بە کۆدەنگی، وە هەرکەس نکۆڵی ئەوەی کرد قسەی لەگەڵ مەکە، ئەگەر پیتەکان مەخلوق بن ئیتر چۆن ئەبێت قورئان غەیر مەخلوق بێت!

ابن قیم قسە ئەکات دەربارەی ئەوەی قورئان کەلامی الله یە، دواتر بەراوردی نێوان وتەی ئەشاعیرە و موعتەزیلە ئەکات و ئەڵێ: حەقیقەتی وتەی ئەشاعیرە لە قورئاندا لەوەی لەبەردەستمانە ئەوەیە کە مەخلوقە .

وە ئەڵێ: سەیرم لێ دێ لە وتەی ئەوکەسەی ڕاجیاوازی نێوان ئەوان و موعتەزیلە باس ئەکات . .

پاشان باسی وتەی ئەشعەریەکان ئەکات لە زمانی خۆیانەوە و ئەڵێت : (وە ئەم دانراوە عەرەبیە کە پیتەکان و وشەکان و سورەتەکان و ئایەتەکانە ئێمە (واتە ئەشاعیرە) و ئەوان (واتە موعتەزیلەکان) کۆکین لەسەر ئەوەی مەخلوقە، بەڵام ئەوە هەیە ئەوان ناوی لێ ئەنێن قورئان، وە ئێمە ئەڵێین ئەوە گوزارشتە لە قورئان، یان گێڕانەوەیە لێوەی)،

پاشان ئەڵێت : وردبەرەوە لەو برایەتیەی نێوان ئەمان و ئەو موعتەزیلانەی کە سەلەف کۆکبوون لەسەر بەکافردانانیان، وە ئەوان (ئەشاعیرە) زیادەڕۆیان کرد

**لەسەروو موعتەزیلەکانیشەوە لە تەعطیلدا. (الصواعق المرسلة على الجهمية والمعطلة).**

**٣٧** - وە ئەوە خوێندراوەیە بە زمانەکان، وە پارێزراوە لە سنگەکان، وە نوسراوە لە موصحەفەکان، لەفظەکەی بیستراوە، واتاکەی گەیشتووە، ناژمێردرێت بە ژماردنی سنگەکان و مەصحەفەکان، وە جیاوازی تێ ناکەوێت بە جیاوازی قوڕگەکان و ئاوازەکان، هەرکاتێک بیەوێت دای ئەبەزێنێت، وە هەرکاتێک بیەوێت بەرزی ئەکاتەوە، وە ئەمە مانای وتەی سەلەفە: لای ئەوەوە هاتووە و بۆلای ئەویش ئەگەڕێتەوە.

**٣٨** - وە لەفظیەکان ئەوانەی ئەڵێن: لەفظمان بە قورئان مەخلوقە موبتەدیعی جەهمین لەلای الإمام أحمد و الشافعي.

الحسين بن أحمد بن إبراهيم الطبري بەمە هەواڵی پێداین وتی: گوێم لە أحمد بن يوسف الشالنجي بوو ئەیوت: گوێم لە أبا عبدالله الحسين بن علي القطان بوو ئەیوت: گوێم لە علي بن الحسين بن الجنيد بوو ئەیوت: گوێم لە الربيع بوو ئەیوت: گوێم لە الشافعي بوو ئەیوت: هەرکەس بڵێت لەفظم بە قورئان یان قورئان بە لەفظی من مەخلوقە ئەوە جەهمیە.

وە ئەمەش گێڕدراوەتەوە لە أبي زرعة و علي بن خشرم و جگە لەوانیش لە پێشەوایانی سەلەف.

**: کە ئەوترێت (بیدعەچی) مەبەست پێی یان بیدعەی فیسقیە یان بیدعەی کوفری، وە ئاشکرا یە کە بیدعەی جەهمیەکان کوفریە .**

**٣٩** - وە ئەو نیشانانەی دەرئەکەون لەکاتی نزیک بوونەوەی قیامەتدا لە دەجال و دابەزینی عیسا ی کوڕی مریم علیه الصلاة وسلم و دوکەڵەکە و ئاژەڵەکە و هەڵهاتنی خۆر لە خۆرئاواوە و جگە ئەوانیش لە نیشانەکانی تر کە هاتوون لە هەواڵە ڕاستەکان حەقن.

**٤٠** - وە باشترینی ئەم ئوممەتە سەدەی یەکەمە کە هاوەڵەکانن رضي الله عنهم.

**٤١** - وە باشترینیان ئەو دە کەسەیە کە رسول الله ﷺ شاهێدی بەهەشتی بۆ داون.

**٤٢** - وە باشترینی ئەو دە کەسە أبو بکر و عمر و عثمان و علي ن رضي الله عنهم.

**٤٣** - وە بیروباوەڕمان وایە خانەوادەی محمد ﷺ و خێزانەکانی و هاوەڵەکانی ترمان خۆش بوێن، وە باسی چاکەکانیان بکەین، وە فەزڵەکانیان بڵاوبکەینەوە، وە زمان و دڵمان بگرینەوە لەوەی ڕوویداوە لەنێوانیان، وە داوای

لێخۆش بوونیان بۆ بکەین لە الله، وە بە شوێنکەوتنیان خۆمان نزیک بکەینەوە لە الله.

**٤٤** - وە وای ئەبینین جیهاد و جومعە و جەماعەت بەردەوامە تا ڕۆژی قیامەت.

**٤٥** - وە گوێڕایەڵی و شوێنکەوتن بۆ کاربەدەستان لە موسڵمانان لە گوێڕایەڵی الله بەبێ سەرپێچیەکەی واجبە - واتا ئەگەر فەرمانیان پێکردین بە گوێڕایەڵی الله ئەنجامی ئەدەین بەڵام ئەگەر فەرمانیان پێکردین بە سەرپێچی الله ئەنجامی نادەین - ، درووست نیە دەرچوون لەسەریان، وە جیابوونەوە لێیان.

**٤٦** - وە هیچ یەکێک لە موسڵمانان تەکفیر ناکەین بە تاوانێک کە کردوویەتی ئەگەرچی تاوانی گەورەش بێت، وە واز لە نوێژکردن لەسەریان ناهێنین، بەڵکو حوکمیان لەسەر ئەدەین بە حوکمی رسول الله ﷺ .

**٤٧** - وە ڕەحمەت ئەنێرین بۆ معاوية رضي الله عنه، وە نهێنی یزید ئەبەینەوە بۆ لای الله تعالى.

وە ڕیوایەت کراوە لێوەی - لە یزید - کاتێک سەری حسین رضي الله عنه ئەبینێت ئەڵێت: (بەڕاستی کەسێک کوشتوویتی کە ڕەحم نەبووە لە نێوانتادا)، وە بەری بووە لەو کەسەی حسین ی کوشتووە رضي الله عنه، وە یارمەتی داوە

لەسەری، وە ئاماژەی پێداوە بە ئاشکرا و نهێنی، ئەمەش بیروباوەڕی ئێمەیە بە ئاشکرا، وە نهێنی - یزید - ئەبەینەوە بۆ لای الله تعالى.

**٤٨** - وە گوزارشتێکی کۆکراوە لە دەروازەی تەوحید ئەوەیە بڵێی: جێگیرکردن بەبێ چواندن، وە نەفیکردن بەبێ پەکخستن - واتە نەفیکردنی لێکچوونی سیفەتی الله تعالى بە سیفەتی دروستکراوەکانی بەبێ پەکخستنی سیفەتەکانی الله تعالى - ، الله تعالى ئەفەرموێ: ﴿لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ﴾ (**الشورى: ١١**).

**٤٩** - وە گوزارشتێکی کۆکراوە لە لێکچووەکانی ئایەتەکانی صیفات ئەوەیە بڵێی: ئیمانم هێناوە بەوەی الله تعالى دایبەزاندووە لەسەر ئەو شێوەیەی خۆی ئەیەوێت، وە ئیمانم هێناوە بەوەی رسول الله ﷺ فەرموویەتی لەسەر ئەو شێوەیەی خۆی ئەیەوێت .

ئەمە ئەو بیروباوەڕەمانە کە دەستمان پێوەی گرتووە، وە داواکارین لە الله تعالى کە بمانژیەنێت و بمانمرێنێت لەسەری، وە بیکات بە وەسیلەمان لەو ڕۆژەی کە ئەوەستین لەبەردەمیا، ئەو بەخشندە و بەڕێزە، وە سوپاس و ستایش بۆ الله ی پەروەردگاری جیهانیان.

والحمدلله رب العالمين

عەقیدەکە بە عەرەبی : **https://t.me/jami3mutun/63**